# نوێژ لەدووای کێ دروستە ؟!

لێهات کوردی

# پێشەکی

## بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على محمدوعلى اله  وصحبه اجمعين.

سوپاس وستايشی بێ پايان بۆ خوای گەورەو باڵا دەست ، صەڵات و سەلام لەسەر گيانی پاكی گەورەمان پێغەمبەری خوا محمد صلى الله عليه وسلم وەلەسەر ماڵ و مناڵە بۆن خۆشەكانی وە لەسەر يارو هاوەڵان و شوێنكەوتوانی تا رۆژی دوايی.

شتێكی زاندراوە لەلايەن هەموو موسلمانێكی راستگۆ وو ئەهلی تەوحيد لەر بلاو بوونەوەی شيرک و كوفر و بيدعە و گومرايی لەنێوان خەلكيدا زۆربەی خەلكی كەوتونەتە نێو شيريک ئيلا مەگەر كەسێک الله رەحمی پێ كردبێت جاكەسی واهەيە بووەتەوە پياوی سەركردە تاغوتەكان يان خۆی تەبەراء ناكاتن لە تاغوتان و شوێنكەوتوانی يان هيچ لە دين نازانێت يان كەوتونەتە ناو شيركی قەبر پەرستی يان شيركی حوكم يان شركی بتی سەردەم كە پەرلەمانە بونەتە رێگر لەهێنانەوەی حوكمی الله جا ئەمە حالی ئەمرۆی كۆمەلگايی موسلمانانە!!!!

جا زۆربەی مزگەوتەكانيش لەجياتی ئەوەيی تەوحيدی لێ، بلاوبكرێتەوە شيرک  و كوفر و بيدعە و بيری نەتەوايەتی لێ بلاو دەكرێتەوە، جا مەلاكانيش زۆربەيان كەوتنەتە ناو شيرک و بيدعە و گومرايی.

به‌ پێویستم زانی نامیلکەیەکی خنجیلانە بنووسم لە بارەیی ئەوەیی ئایە نوێژ لەدوای کێ دروستە؟

جا ئەم بابەتە لەچەند بەشێک پێک دێت

بەشی یەکەم :نوێژ کردن لەدوای کافرو موشریک

بەشی دووەم :نوێژ کردن لەدوای بیدعەچیەکان

بەشی سێیەم: نوێژ کردن لەدوای مجهول الحال واتە کەسێک حالی نەزاندراوە نازانی موسلمانە یان نا.

بەشی چوارەم :ئایە گەر نوێژت لەدوای کەسێک کرد نەت دەزانی موسلمانە یان کافرە دوواتر بۆت روون بوویەوەکە کافرە ئایە نوێژەکەت دووبارە دەکەیتەوە یان نا؟

بە پشتیوانی الله بابەتەکان روون دەکەینەوە بەووتەی زانایانی ئەهلی سونەو جەماعەت

داواکارم لە الله ئەم کارەم ببێتە هۆکاری وەرینی گوناهوو تاوانەکانم و

ڕەزامەندی الله.

نوسینی لێهات کوردی

## [نوێژکردن له دوای کافرو موشریک]

به ووتەی هەموو زانایان دروست نیه نوێژ بکەی لەدوای کەسێک کەکافره یان موشریکه یان کەوتبێتەناو یەکێک لەهەلوەشێنەرەوەکانی ئیسلام چونکه ئەو کەسه بەخۆی نوێژی قبول نیه جا چ جای ببێته پێشنوێژ خوێنی موسلمانان

ئیمامی شافعی دەلێ [أن الكافر لا يكون إماما فی حال "الأم للشافعي" بەرگی2 لاپەڕە330

واته (بێگومان كافر بەهیچ جۆرێك نابێته ئیمام و پێشنوێژخوێن)

ئیمامی نەوەوی دەڵێ:( لاتصح الصلاة خلف احد من الكفار على اختلاف انواعيهم وكذا المبتدع الذي يكفر ببدعته )المجموع شرح المهذب للنووي" بەرگی4 لاپەڕە147

واته (نوێژكردن دروست نیه لەدوای هیچ یەكێك له كافرەكان، به هەموو جۆره ،جیاوازیەكانیانەوە، وه هەروەها -نوێژ دروست نیه له دوای- كەسێكی بیدعەچی كه به بیدعەكەی كافر دەبێت)، واته جولەكه و دیان و ئاگرپەرست و هەڵگەڕاوه و دەهری و زندیق و شوعی و عەلمانی وه هەمووجۆرەكافره كان)

وه (ئیبن قودامەی مەقدسی) دەڵێ:" ولا تصح الصلاة خلف كافر" المغني لإبن قدامة المقدسي" بەرگی3 لاپەڕە18

واته (وه نوێژ لەدوای بێ باوەڕ دروست نیه)

وە لە (موسوعة الفتاوى)ى كوێتیدا هاتووە:" اتفق الفقهاء على انه يشترط في الامام ان يكون مسلما وعلى هذا لاتصح الصلاة خلف من هو كافر يعلن كفره .

الموسوعة الفتاوى الكويتية" بەرگی6 لاپەڕە 202 لە لێكدانەوەی وشەی إمام/إمامة الصلاة" لە بڕگەی(5 (لەژێر باسی "شروط الإمامة

هاتووە (زانایان ڕێککەوتون لەسەر ئەوەی کە مەرجە پێشنوێژ خوێن موسوڵمان بێت، بۆیەش نوێژ لەدوای کافرێك دروست نیە کە کوفرەکەی ئاشکرا کردووە)

هاتوە لە کتێبی بحر الرائق کە خاوەنی کتێبەکە ابن نجيم الحنفي دەفەرمووێ "گەر کەسێک تووشی کوفر بوو کافربوو نوێژکردن لەدوایەوەیەوە دروست نیە لەئەصلدا نوێژ دروستە لەدوای ئەهلی هەواو ئارووز ئیلا جەهمیەکان و قەدەری و رافیزە رۆچوەکان و وە ئەوانەی دەڵێن قورئان مەخلوقە یان خیطابیەکان یان موشەبیهەکان ئەمانە نوێژیان لە دوا دروست نیە (ئەمانە کۆمەلێک گروپی کافربوون بۆیە دەفەرموێ نوێژیان لەدوا دروست نیە ) وەهەر کەسێک لە ئەهەلی قیبلە بێت بەلام هەواوو ئارەزووی نەگەیشتێبە رادەیەک تاحوکمی کوفری بەسەر دابدەین ئەمە نوێژی لەدوا دروستە بەلام مکروهە واتە ناپەسەندە نوێژی لەدوای ئەهلی هەوا بکەین وەنوێژ لەدوای ئەو کەسەش دروست نیە کە ئینکاری شەفاعەتی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم یان دوومەلائیکەتی سەرشان یان بینینی خودا لە قیامەت دەکات"

جا تەماشاکە ئەم زانایە کۆمەڵێک گروپی کافری ژمارد دوواتر کۆمەڵێک کوفری ژمارد کە هەر کەسێک بێت کەوتێبێتە ناو ئەمانە ئەمە نوێژەکەت پوچەڵە خوالێت قبول ناکاتن.

ابن قدامەی مەقدیسی دەفەرموێت گەر نوێژت کرد لەدوای موشریکێک یان

ئافرەتێک یان نێرەمووکێک ئەوا نوێژەکەی خۆت دووبارە دەکەیتەوە چونکە ئەمانە نوێژیان لەدوا جائیز نیە.

امامی البویطی دەفەرموێ پرسیارم لە ئیمامی شافعی کرد کە ئایە نوێژ بکەم لەدوای رافیزیەکان واتە شیعەکان ووتی نوێژ مەکە لەدوای رافزی و قەدەری و مورجیئەکان امامی بویطی دەفەرموێ ووتم باسی سیفاتەکانی ئەم گروپانەم بۆ بکە امامی شافعی فەرموی هەر کەسێک بڵێ ئیمان تەنها قەولە ئەمە مورجیئەیە.

(((مورجئەکان مەدخەلی و بەناو سەلەفیەکانی خۆمان دەگرێتەوە کەدەڵێن ئیمان تەنها قەولە وگوفتاری زووبانە وەبونەتە خزمەت کاری سەرکردە تاغوتەکان و عەلمانیەکان بۆیە بەووتەی امامی شافعی نوێژیان لەدوا دروست نیە)))

وەهەر کەسێک بڵێ امامی ابوبکر و عمر رضی الله عنهما امام و خەلیفەی موسلمانان نەبوونە ئەمەش رافزیە واتە شیعەیە وەهەرکەسێک مەشیئەتی کارەکان نەگرێنێتەوە لای خودا بەڵکو بگەرێنێتەوە لای نەفسی خۆی یان بڵێ خوا زانیاری بەکارەکان نیە تاشتەکان روودەدەن ئەمە قەدەریە [سیر اعلام نبلاء للذهبي بەرگی 10 لاپەرە31].

جا سەرنج بدە ئەم سێ گروپە کافرە امامی شافعی دەفەرمویٚ بە هیچ جۆرێک نوێژلەدوایان دروست نیە.

پرسیارکرا لە پێشە وا_ئەحمەد ئایا نوێژ لە دوای کە سێکەوە دەکرێت کە جوێن بە معاویە دەڵێت؟ فەرمووی : نەخێر و هیچ ڕێزێکی نیە [ ٢٩٦ مسائل ابن هانيء ]

سأل رجل الإمام أحمد بن حنبل:

پرسیار کرا لە ئیمامی ئەحمەد:

فقال : يا أبا عبد الله، أصلي خلف من يشرب المسكر؟

وترا :ئەی باوکی عبدالله نویژ لە دوایی مەشروب خۆر بکەین؟

قال : لا

فەرمویی: نا

قال : فأصلي خلف من يقول القرآن مخلوق؟

ووتیان: ئەی لە دوای کەسی بڵی قورئان مەخلوقە؟

فقال : سبحان الله !

فەرمویی: سبحان الله !

أنهاك عن مسلم تسألني عن كافر؟!

مەشروب خۆر موسڵمانە ڕیگریم کرد و پرسیاری کافر دەکەن

[ 378/ 2 طبقات الحنابلة ]

جا تەماشاکە امامی احمد دەفەرموێ نوێژ لەدوای ئەوکەسەی جوێن دەداتە سەحابەیەک یان ئەو کەسەی دەلێ قورئان مەخلوق و دروست کراوە دروست نیە یان دەفەرموێ لەدوای مەشروب خۆر نوێژ دروست نیە کە موسلمانیشە ئەی چۆن تۆ دەچی نوێژ دەکەی لەدوای ئەو مەلا دین فرۆش و کافرانە کە رۆژانە لەناو کوفرو شیرک دان بیربکەوە نوێژ شتێکی زۆرگەورەیە لەدوای هیچ کەسێک نوێژنەکەی ئیلا ئەو کەسە نەبێت کەموسلمان و ئەهلی عەقیدەیە

***زانایان رەحمەتی الله یان لێبێت لەسەر دەمی خۆیان هەر گروپێکیان دیتبێت کە کەوتێبتە ناو کوفرەوە بۆ خەلکیان روون کردۆتەوە کە نوێژ لەدواوەیان دروست نیە، بۆ نمونە امامی شافعی لەسەردەمی خۆی دەی فەرموو نوێژ لەدوای رافیزە و مورجیئەو قەدەری دروست نیە وە ئیمامی احمد و یحی کوری معین دەیان فەرموو نوێژ لەدوای جەهمیەکان دروست نیە وە یحی کوری معین دەی فەرموو بەبەردەوامی نوێژی جومعەم دووبارە دەکردەوە لەوەتەی مەئمون سەری هەلداوە ((السنة لعبدالله بن احمد)) وە ئەم ووتەیە لە کشف شبهاتی شیخ خالید غامیدی هاتوە) چونکە مەئمون دەی ووت قورئان مەخلوقە وە امامی بربهاری بەهەمان شێوە دەی فەرمووێ نوێژ لەدوا ی جەهمیەکان مەکەن، وە امامی ابن نجیم الحنفي دەی فەرموو نوێژ لەدوای ئەوکەسانەی کە دەلێن قورئان مەخلوقە یان شەفاعەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم رەت دەکەنەوە یان خودا نابیندرێ لەقیامەت دروست نیە نوێژیان لەدوا بکەی ئەمانەش سیفاتی موعتەزیلەکان بوون، وە امامی محمد کوری عبدالوهاب لەسەردەمی خۆی خەلکی ئاگادار دەکردەوە کەنوێژ لەدوایی سۆفیە موشریکەکان نەکەن کە هاوار دەکەنە غەیری خودا.

جائەی ئەو کەسەی خۆت بە موسلمان دەزانی ئاگادار بە نەکەی نوێژ لەدوای ئەو کۆمەلە کافرانەی سەردەم بکەی کە کەووتونەتە ناو کوفرو شیرک، وەک هەر کەسێک چوبێتە ناو حیزبە عەلمانیەکان یان پشتگیریان بکا یان سەریان بخایان دەنگیان پێ بدات جاکەسەکە مەلا بێت شێخ بێت سەید بێت هەر کەسێک بێت نوێژی لەدوایەوە دروست نیە واحیساب بکە نوێژت لەدوا ی ئەبو جەهل کردووە، یان ئەو حیزبە بەناو ئیسلامیانەی کە چونەتە سەر رێبازی پەرلەمانی دیموکراسی یان بەژداری هەلبژاردن دەکەن یان حیزبەعەلمانیەکان بەموسلمان دادەنێن یان دووعا بۆسەربازی تاغوتان دەکەن ئەمانەش نوێژیان لەدوا دروست نیە، یان مەدخەلیەکان یان بلێین بەناو سەلەفیەکان کەبوونەتە پشتگیری عەلمانیەکان وە سەرکردە کافرەکان بەوەلی ئەمر دەزانن یان جاسوسی لەسەر موسلمانان دەکەن یان دوعا بۆ سەربازی تاغوتان دەکەن ئەمانەش نوێژیان لەدوا دروست نیە.

یان سۆفیەکان کە هاوار دەکەن غەیری خودا یان عیبادەت دە کەن بۆ شێخ و

ئەولیاء و پێغەمبەران ئەمانەش نوێژیان لەدواوە دروست نیە جا هەر کەسێک کەوتێبێتە ناو شیرک و کوفر بەهیچ جۆرێک نوێژیان لەدوا جائیز نیە وەگە ر نوێژیان لەدوا بکەی بشزانی کە کوفریان هەیە نوێژەکە شت دووبارەنەکەیەوە وەکو تارک الصلاة حیسابت بۆدەکرێ جا نوێژیان لەدوا دروست نیە تا تۆبەی ئەمانەمان بۆ روون دەبێتەوە وەک ئیمامی شافعی رحمە الله دەفەرموێ گەر کەسێکی موسلمان مورتەد بویەوە دوواتر بوە ئیمام و پێشنوێژ خوێن هەر مورتەدیش بوو دروست نیە نوێژی لەدوا بکەی تاکو تۆبەی ئەو کەسەت بۆروون دەبێتەوە پێش ئەوەی ئیمامەتیان بۆدەکا جائەگەر تەوبەی کرد پێش ئەوەی ئیمامەتی بکا دروستە نوێژی لەدوا بکەی.

( نوێژ کردن لەدووای بیدعەچیەکان )

ئەهلی سونەو جەماعەت دەفەرموون دوو جۆرە بیدعەمان هەیە بیدعەیەک کە مرۆڤی موسلمان لە دین دەباتە دەرەوە کەسەکەپێی کافر دەبێت  وەک سورانەوە لەدەوری قەبر و دار بەنیەتی عیبادەت و نیزک بوونەوە لە خوا بەهۆی ئەم قەبرە ئەمە شیرکە یان نەزر کردن یان دوعا کردن بۆ غەیری خوا وەنوێژ لەدوای ئەم بیدعەچیە کافرانەش دروست نیە.

نووی دەلێ: وكذا المبتدع الذي يكفر ببدعته.المجموع شرح المهذب بەرگی چوار لاپەڕە 147.

واتە وە هەروەها نوێژ دروست نیە لەدوایی کەسێکی بیدعەچی کە بە بیدعەکە یی کافر دەبێت.

وە(ابن المنذر) و هەندێك لەشافیعیەکان دەڵێن ـ من نكفره ببدعته كالذي يكذب على الله ورسوله ببدعته ،لانصلى خلفه. المقنع والشرح الكبير و الإنصاف" بەرگی4 لاپەڕە368

واتە: (ئەوەی بە هۆی بیدعەکەیەوە کافری دەکەین، وەك ئەوەی بە بیدعەکەی ،درۆ لەسەر خوا یان پێغەمبەرەکەی دەکات، ئەوە نوێژی لە دوا ناکەین)

وەبیدعەیەکی ترمان هەیە کە مرۆڤی موسلمان لە دین ناباتە دەرەوە وەک یادکرنەوەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم یان هەر جۆرە بیدعەیەکی تر کە مرۆڤی موسلمان لەبازنەی ئیسلام ناباتە دەرەوە ئەوا نوێژ لە دوایەوە دروستە

بەشەرتێک ئەم بیدعەچیە هیچ جۆرە شیرکێک وکوفرێکی نەبێت تەنها ئەم بیدعانەی هەبێت نوێژکردن لەدوایانەوە دروستە، ئەممەش فتوای اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والإفتاء هی ولاتی سعوديە.

وە قەولێک هەیە لەامامی مالیک رحمه الله کە دەفەرموێ نوێژ لە دوای هەموو بیدعەچیەکان دروست نیە بەلام قەولی راست لای زانایان ئەوەیە گەر بیدعەچیەکە بیدعەکەی نەگە یشتە رادەی کوفر دروستە نوێژی لەدوابکەیی.

*** وەخالێکی تر دروستە نوێژ لەدوای کەسێکی زالم بکەی کە زولمەکەی نەگەیشتبێتە رادەی کوفر چونکە عبدالله ی کوری عمر رضی الله عنهما نوێژی لەدوای حەجاج کوری یوسفی ثەقەفی دەکرد کە کەسێکی خوێن رێژ و زالم بوو.

****تێبینی*** دروستە نوێژ بکەی لەدوایی هەموو کەسێکی گوناهکار کەکوفرو شیرکی نەبێت بۆنمونە ئیمامەکە مەشروب دەخواتەوە یان دزی دەکات هاوشێوەی ئەم گوناهانە چونکە عبدالله کوڕی مسعود رضی الله عنه لەدوایی وەلیدی کوڕی عقبة کوڕی معیط نوێژی دەکرد کە مەشڕوب خۆڕیش بووو.

{نوێژ کردن لەدوای مجهول الحال}

واته کەسێک نه تەوحیدت لێدیوه نەشیرک حالی نادیاره، ئەم مەسئەلەیه دوو راو بۆچونی زانایانی لەسەره

رای یەکەم ـ دەفەرموون لەسەردەمی فیتنه که شیرک و بیدعه و خورافیات زۆربوو لەناو موسلمانان ئەوا لەم حالەتەدا نوێژ لەدووای هیچ کەسێک ناکەی که نای ناسی ئیلا نوێژ لەدوای کەسێک دەکەی که دەیناسی موسلمانەو ئەهلی عەقیدەیه.

- رای دووەم دەفەرموون دروسته نوێژ لەدوای هەموو کەسێکی نەناسراوبکەی که نای ناسی و وەهیچ زۆره شیرک و کوفرێکت لێنەدیوه.

**** بەلگه کانی رای یەکەم ****

ئیمامی سفیان الثوري به شعیب کوڕی حربی فەرمووو: صلاة الجمعة والعیدین، صل خلف من أدركت، وأما سائر ذلك، فأنت مخير أن لا تصلي إلا خلف من تثق به وتعلم أنه من أهل السنة والجماعة.

[١٧٠/١ اللالكائي، شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة]

واته: نوێژی جومعه و هەردوو جەژنەکه بکه لەدوای هەر کەسێك که پێی گەیشتی، بەڵام نوێژەکانی تر تۆ هەڵبژاردەت به دەستی خۆته که نوێژ نەکەیت تەنها لەدوای ئەو کەسه نەبێت کەوا متمانەت پێی هەیه، وه دەزانیت و دڵنیایت کەوا ئەو کەسه لەئەهلی سوننه و جەماعەیه.

(واته مستور الحال بێت، کەسێکی موەحیدە و هیچ کوفر و شیرکێکی نیە بەڵام عەقیدەکەی نەزانراوە)

له طبقات الحنابلة هاتوه: قال المروزي سئل احمد امر في الطريق فـأسمع الاقامة ترى ان اصلي فقال : قد كنت أسهل ، فأما إذ كثرت البدع ، فلا تصل إلا خلف من تعرف)

المروذي پرسیاری لەئیمام ئەحمەد کرد و پێی فەرموو: لەڕێگادا دەڕۆم و گوێم لە ئیقامە کردنە بۆ نوێژ ئایا بچم نوێژیان لەگەڵ بکەم؟ ئیمامی ئەحمد فەرمووی: من سەرەتا لەم بابەتە ئاسانکاریم دەنوواند بەلام کاتێك بیدعە زۆر بلابویەوە ئەوا نوێژ مەکە ئیلا لەپشتی کەسێکەوە نەبێت کە بیناسیت ئەهلی سوننەیە.

** قال أبوعبيد بن القاسم بن سلام لايرى جواز الصلاة خلف امام يعنه المأمون.

هذا الاثر جاء في السنة لعبدالله بن احمد و كشف الشبهات لشيخ خالد الغامدي لاپەڕە 249

واتە وایان نەدەبینی کە نوێژ جائیز بێ لەدوای ئەو ئیمام ومەلایانەی کە مەئمون دایان نابوو لەمزگەوتەکان جا رەحمەتی الله ت لێبێ تەماشاکە کێ ئێستا مەلاکان لەمزگەوتەکان دادەنێ بەلکو وەزارەتی ئەوقافی نیفاقی کافر نیە کەسەدان کوفریان هەیە تەنها مەلای بەدلی خۆیان دادەنێن جا مەئمون چەند کوفرێکی هەبوو وەک دەی ووت قورئان مەخلوقە لەچەند شتێکی تریش موافەقەی جەهمی و موعتەزیلەکانی دەکرد ئەو مەلایانەی لەمزگەوتەکان دادەنا کە دەیان ووت قورئان مەخلوقە بەلام مەئمون حوکمی بەقورئان و

حوکمه شەرعیه کانی  دەکرد بەلام امام ابو عبید دەفه رموێ مەئمون هەر ئیمامێکی  دانابێ نوێژی لەدوا دوروست نیه.

بەلام ئەمەی ئەمرۆ لەکوردستانی خۆمان نەک هەرحوکم به قورئان ناکا بەلکو دژیایەتی ئایەتەکانی قورئانیش دەکا جا چۆن نوێژ لەدوای مەلایەک دەکەی که ئەوقافی کافر دایناوە.

ـ ابن عەساکر فه رموویه تي: له نوسراوی هەندێ له دیمەشقي بينيومه که الشيخ الامام الفقيه أبو الحسن علي بن احمد السهيلي له دمشق فه رمويه تي: كنت ببيلاد واكثرهم رافضي وكنت أصلي فيها منفردا "

من له ولاتيك بووم زوربه يان رافيزه بوون وه من به تاك نويژم ئه كرد له و ولاتەدا ( واتا نه ده چوم بو جه ماعه ت) [٢٤٢/٤١تاريخ دمشق لابن عساكر].

جا سەرنج بدە ئەم زانایه له و ولاتەی لێی بووە زۆربەیان کافری رافضی شیعه بوون بۆیه نوێژی بەتەنها دەکرد بۆیه ئەمانەی لەسەر ئەم بۆچونەن دەفەرموون گەر لەولاتێک دەژیای کەزۆربەیان کافربوون ئەوا نوێژی خۆت بەتاک دەکەیی.

****** بەلگە کانی رای دووەم *******

ابن تیمیە رحمە اللە لە مجموع الفتاوی لە مجلدی 4 لا 542ـ دەفەرموێ نوێژ دروستە لەدوای هەموو موسلمانێکی مەستور حال [واتە حالی نادیاربێ] بەیەک دەنگی چوار ئیمامەکە و تێکرای موسلمانان وەهەرکەسێک بلێ نوێژی جومعە یان جەماعەت لەدوای هیچ کەسێک ناکەم ئیلا ئەو کەسە نەبێ کەبزانم لەباطن یان لەناخەوە عەقیدەی چۆنە ئەوا ئەو کەسە موبتەدیعە وەموخالەفەی سەحابە و تابعین وەهەر چوار ئیمامەکەی کردووە.

وەهەروەها ابن تیمیە رحمەاللە : دەفە رموێ دروستە نوێژ لەدوای کە سێک بکەی کە هیچ بیدعەو فاسق بونێکت لێنەدیتبێت بەیەک دەنگی هەر چوار ئیمامەکە [واتەچوارمەزهەبەکە]

وە دەفەرمووێ شەرت نیە مەئموم بزانێ عەقیدەی ئیمامەکەی چۆنە یان ئیمتیحانی بکاتن پێی بلێت ئەرێ عەقیدەت چۆنە بەلکو نوێژدەکەی لەدوای هەموو مەستورحالێک هەمووکەسێک کەحالی نادیارە [مجموع الفتاوی ](مجلدي 23 ـ لا 351]

جا ئامۆژگاریم بۆ موسلمانان نابێت زۆر لەسە ر ئەم مەسئەلانە کێشە دروست بکەن گەر کەسێکت دیت نوێژی لەدوای کەسانێک نەدەکرد کەنەی دەناسین یان نەی دەزانی عەقیدەیان چۆنە رەخنەی لێمەگرە چونکە لەسەر بۆچون و رای یەکەمە، وەگەر کەسێکت دیت کە نوێژی لەدوایی کەسانێک دەکرد کەنەی دەناسین یان نەی دەزانی عەقیدەیان چۆنە رەخنەی لێمەگرە چونکە لەسەر بۆچون و رای دووەمە بۆیە بەکامیان دەکەی هەربۆت دروستەو وەگونهاباریش نابیت واللە تعالی اعلم.

ئەگەر نوێژت لەدوای کەسێک کرد کەنەت دەناسی دواتر بۆت روون بوویەکە کەسەکە کافرە ئایە نوێژەکەت دووبارە دەکەیە وە یان نا؟

لەسەر ئەم مەسئەلەیەدا دوو ڕا وبۆچون هەیە:

یەکەمیان کە جمهوری زانایانن دەفەرموون دەبێت نوێژەکەت دووبارەبکەیتەوە ئەمەش لە [صحيح فقه السنة لاپەرە 464هاتوە]

چونکە کەسەکە نوێژی قبول نیە چۆن تۆ نوێژەکەت دووبارە ناکەیتەوە!!!

هەروەها نووی لە منهاج الطالبين دەفەرموێ: ولو بان امامه امرأة او كافرا معلنا قيل او مخفيا وجبت الاعادة.

دواتر دە فەرموێ قلت الاصح المنصوص وقول الجمهور ان مخفي الكفر هنا كمعلنه ، والله اعلم. انتهى كلامه

واتە گەر بۆت روون بوویەوە کە ئیمامەکەت ئافرەتە یان کافرێکی ئاشکرایە

واتە کوفرێکی بەعەلەنی و بەئاشکرا کردبێت یان ووتەیەکی بێهێز هەیە دەڵێ یان کوفرەکە شاراوەش بێت دەبێت نوێژەکەت دووبارە بکەیتەوە دواتر نووی دەڵێ ووتەی راست لەنەصی امامی شافعی و جمهوری زانایان ئەوەیە کە کوفری شاراوەش وەکو کوفری ئاشکراوایە خواش زاناترە.

ئەمە بۆچوونی یەکەمە کە دەفەرموێت دەبێت نوێژەکەت دووبارە بکەیتەوە کەقەولێکی بەقوەتە.

ووتەی دووەم دەفەرموون نوێژەکەت دووبارە ناکەیتەوە ئەمەش ڕاو بۆچوونی ابن حزم و أبو ثور و المزنیه چونکه قیاس دەکەنە سەر ئیمامێکی بێ دەستو نوێژ کە پاش نوێژەکە بۆت روون دەبێتەوە کە ئیمامەکە بێدەستو نوێژە نوێژەکەی تۆ قبولە، بەلام دەبێت ئیمامەکە نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە ئەم زانایان دەفەرموون ئەم حالەتەش وەکو حالەتی بێدەستو نوێژەکە وایە سەرچاوە ئەم رەئی ابو ثور و المزنی.

امامی ابن قدامە مەقدیسی هێناویەتی وەقەولی ابن حزم لە محلی کتێبی

خۆی لەمجلدی چوار لاپەرە51 هاتوە وەیان لە صحیح فقه السنة لە مجلدی یەک لاپەرە 464هاتوە.

قەولی راجح و بەقوەت قەولی یەکەمە کە دەبێ نوێژەکەت دووبارەبکەیتەوە والله تعالی اعلم .

لە کۆتای دا داواکارم لە الله ئەمە ببێتە هەشیارکردنەوەی موسلمان بۆئەوەی لە خەمی نوێژەکانیان دابن کەنوێژ لەدوای کێوەبکەن وببێتە رەزامەندی الله جل جلاله.

لەدوعای خێر بێبەشمان مەکەن.

وصلـــى الله علـى محمد وعلى اله وصـحبه وسلم

(نووسینی: لێهات کوردی)